ENDESE



دۆستۆیڤسکی

# دزێکی ڕاستگۆ

وەرگێڕانی:

کاروان مەحمود



بەیانییەک، کە خەریکی خۆئامادەکردن بووم تا بڕۆم بۆ سەر شوێنی کارەکەم، ئەگرافینا (کە چێشتلێنەر، جلشۆر، هەروەها خاوەنماڵیشم بوو لەیەک کاتدا) خۆی کرد بە ژوورەکەمدا و کاتێک دەستی کرد بە گفتوگۆکردن، لەڕادەبەدەر تووشی سەرسووڕمانی کردم.

ئەو ئافرەتێکی تەواو ساویلکە بوو، بەدرێژاییی ئەو شەش ساڵەی لەگەڵما بوو، ڕۆژانە هەرگیز لە دوو یان سێ وشە زیاتری نەدەوت، کە ئەویش وەبیرهێنانەوەی من بوو بۆ خوانی ئێوارە... هەرچۆنێک بێت، هەرگیز گوێم لێی نەدەبوو.

لەناکاو دەستی بە ئاخاوتن کرد و گوتی:

"هاتووم بۆ لاتان، گەورەم، تا دەربارەی بەکرێدانی ئەو ژوورە بچووکە زیادەوە قسەتان لەگەڵ بکەم."

"کام ژوورە زیادەیە؟"

"بێگومان ئەو ژوورە بچووکەی نزیکی موبەقەکە. ئەبێت چ ژوورێک لەو زیاتر بێت؟"

"بۆچی؟"

"بە شێوەیەکی گشتی لەبەر چی خەڵک ژوور بەکرێ ئەگرن؟"

'بەلام کێ ژوورێکی بچووکی وا بەکرێ دەگرێت؟'

"کێ بەکرێی دەگرێت! بەدڵنیاییەوە کرێچی! ئەبێت لە کرێچی زیاتر، کێی تر هەبێت ژوور بەکرێ بگرێت!"

"بەلام دایکەکەی دایکم، ئێرە خۆی هێندە گوشاد نیە، لەم ژوورەدا، تەنانەت جێگەی تەختەخەوێکیش بەزەحمەت دەبێتەوە؛ کەسێک چۆن ئەتوانێت لە وەها شوێنێکدا بژی؟"

"بەلام بۆچی ئەبێت تێیدا بژی! ئەو تەنیا شوێنێکی دەوێت، تێیدا بخەوێت... ئەو لە نزیک شوێنی دانیشتنی پەنجەرەکەوە ئەژی."

"کام شوێنی دانیشتنی پەنجەرەیە؟"

"ئەمە یانی چی؟ کام شوێنی دانیشتنی پەنجەرە؟ وا

خۆت نیشان دەدەیت، وەک ئەوەی نەزانیت! ئەو دانەیەی ناو هۆڵەکە. ئەو لەویدا دادەنیشیت و درووومان دەکات، یاخود کاریکی دی ئەنجام دەدات. بەلام لەوانەشە لەسەر کورسییەک دانیشیت: ئەو کورسیی خۆی هەیە... هەروەها میزیکیش و هەندێ کەلوپەلی تریشی هەیە."

"بەلام ئەو کەسە کێیە؟"

"پیاویکی باشە، پیاویکی ژیر و دنیادیدەیە. خواردنی بۆ ئامادە دەکەم، تەنها سێ ڕۆبلی زیوی لێ وەردەگرم بۆ هەر مانگیک، لە بەرامبەر خواردن و شوینی حەوانەوەکەی..."

لە کۆتاییدا، پاش هەوڵیکی زۆر، ئەوەم بۆ دەر کەوتبوو، کە پیاویکی تەمەندار قسەی لەگەڵ ئەگرافینا کردبوو، تا هەرچۆنیک بووە، قایل بیت بەوەی وەک کرێچییەک لە چیشتخانەکەیدا بیت.

کاتیک ئەگرافینا بیرۆکەیەک بهاتبایاتە سەریەوە، دەبوو ئەو شتە جێبەجێ بکرایە؛ بەپێچەوانەوە، دەمزانی ناهێڵیت هەر وا بەناسوودەیی لێی دانیشم، تا ئەگات بەو شتەی خۆی مەبەستیتی. لەو دۆخانەی کاتیک شتەکان بە پێچەوانەی خواستی ئەو بڕۆشتبا، ئەوە دەستبەجێ لە جۆریک لە پیشخواردنەوە ڕۆدەچوو، ئینجگار غەمبار دەبوو، بۆ ماوەی دوو یان سێ هەفتەش بەردەوام بەم شێوەیە دەمایەوە. لەو ماوەیەی وای لێ دەهات،

خواردنەکـە هەمیشـە بۆگەنـی دەکـرد، جلوبـەرگ دیـار نەدەمـا، عەردەکـە پـاک نەدەکرایـەوە؛ بەکورتـی، هەمـوو شتەکان لـەو ماوەیـەدا ئەشێوا بەسـەر یـەکا. زۆر لەمێژ بوو پەیم بە ڕاستیی ئـەوە بردبوو، کـە ئـەو ئافرەتـە کەمدووە بێتوانا بـوو لـەوەی بڕیارێـک بـدات، یـان دوابڕیـاری خـۆی بـدات لەسـەر ئـەو بیرۆکانـەی لـە خـودی بیرکردنەوەکانـی خۆیـەوە سـەرچاوەی دەگـرت؛ ئەگـەر کاتێـک ڕووشـی بدایە، بەرێکەوت جۆرێک بیرۆکە یان خواستی دەستگرتن - بەسـەر - شـتێکدا، لـەو مێشـکە لاوازەیـدا دروسـت ببووایـە، بەرگرتـن لـە جێبەجێکردنـی ئـەو بیرۆکەیـەی یـان ئـەو خواسـتەی زۆر بەسـادەیی واتـای کوشـتنی ئـەو لـە ڕووی دەروونییـەوە بۆ ماوەیـەک. بـەم شـێوەیە بۆ ئـەوەی منیش تەنیا مێشکی خۆم ئاسوودە بکـەم، دەستبەجێ بـە پێشـنیارەکەی قایـل بـووم.

پێم وت:

"ئایا ئـەم کەسـە هیـچ نەبێت پێناسێک، گوزەرنامەیـەک، یان هەرشـتێکی تـری لـەم بابەتانـەی هەیـە؟"

"ئـەی چـۆن نییەتـی؟ بەدڵنیاییـەوە هەیەتـی. پیاوێکـی باشـی وەک ئـەو... پیاوێکـی دنیادیـدەی وەک ئـەو، گومانـی تێدا نییە هەموو ئـەو شتانەی پێیە، کە پێویستە پێی بێت. بەڵێنیشـی داوە، مانگـی سـێ ڕۆبڵـم بداتـێ."

سەرلەبەیانیی ڕۆژی دواتر، کرێچییە نوێیەکەمان لە کوختە سادە و چۆلەکەم دەر کەوت! بەلام دەرکەوتنی ئەو، هیچ نەبووە مایەی بێزاریم... بەپێچەوانەشەوە، بە شێوەیەک لە شێوەکان دلخۆشی کردم. من زۆر گۆشەگیرانە و ژیانێکی سۆفییانە ئەژیم. نزیکەی هیچ ئاسیاوێکم نییە، زۆر بەکەمیش لە مال دەر دەچم. دە سالێک دەبێت ژیانێکی سۆفییانە دەژیام. تەنانەت بە شێوەیەکی سروشتی خووشم بەو گۆشەگیرییەوە گرتبوو. لەگەل ئەوەشدا، دە یان پازدە سال، یان زیاتر، لە هەمان تەنهایی لەگەل کەسێکی وەک ئەگرافینا و لە هەمان خانووشدا، هەر بەڕاستی دیمەنێکی زۆر دلتەنگکەر بوو. هەر لەبەر ئەوە، ئامادەبوونی مرۆڤێکی تر، مرۆڤێکی بێ زیان و هێمن لە مالەکەدا، لەناو وەها بارودۆخێکدا، وەک دیارییەکی بەنرخ وایە، کە لە ئاسمانەوە هاتبێت.

"ئەگرافینا ڕاستی کرد؛ کرێچییەکە مرۆیەک بوو، کە شتگەلێکی زۆری لە ژیانی خۆیدا بینیبوو. لە ڕێی گوزەرنامەکەیەوە دەر دەکەوت، کە ئەو سەربازێکی خانەنشینکراوە، لە ڕاستیدا، هەر زوو کە لێی ورد بوومەوە، تەنانەت پێش ئەوەی تەماشای گوزەرنامەکەشی بکەم، خۆم پەیم بەوە برد.
شتێکی تر کە هەر بە سەیرکردن بۆم ڕوون بۆوە

ئەوە بوو، دراوسێکەم "ئاستافی ئیڤانیچ" سەر بە باشترین جۆری سەربازەکان بوو، بۆیە هەر لە سەرەتاوە یەکترمان خۆش ویست، ئا بەم شێوەیەش ئاشتی و ئاسوودەیی ڕژایە ناو ژیانمانەوە. باشترین شتیش ئەوە بوو، کە ئاستافی ئیڤانیچ هەندێک جار چیرۆکگەلی زۆر خۆشی دەگێڕایەوە، زۆر جار ڕووداوەکانی ژیانی خۆی لە شێوەی چیرۆکی سەرنجڕاکێشدا دەگێڕایەوە.

بە شێوەیەکی گشتی، بوونی چیرۆکبێژێکی لەم شێوەیە، لەم ژیانە جاڕزکەر و وشکەی مندا، بەڕاستی وەک گەوهەرێکی بەنرخ بوو.

جارێکیان بە هۆی ڕووداوێکەوە کە ڕووی دا، چیرۆکێکی بۆ گێڕامەوە، کە بەڕاستی کاریگەرییەکی زۆر قووڵی کردە سەر دڵ و دەروونم.

جارێکیان کە وا ڕووی دا بەتەنها خۆم لەماڵەوە بووم، دوای ئەوەی ئاستافی و ئەگرافینا بۆ هەندێک کاری خۆیان چووبوونە دەرەوە، لەناکاو گوێم لە دەنگی پێی یەکێک بوو خۆی کرد بە ماڵەکەدا. هەستم کرد ئەوە کەسێکی بێگانە بێت؛ بۆیە گورج لە ژوورەکەم وەدەر کەوتم، خۆم کرد بە داڵانەکەدا و پیاوێکی بەژنکورتم بەرچاو کەوت، سەرەڕای ئەوەی کەشوهەواکەی زۆر سارد بوو، کەچی جلێکی زۆر تەنکی بەبێ پاڵتۆ لەبەر دابوو.

"چیت دەوێت، براکەم؟"

"ئایا فەرمانبەری میری، "ئەلکساندرۆڤ" لێرە ئەژی؟"

"برای گچکە؛ هیچ کەسێک بەم ناوەوە لێرە ناژی، ڕۆژێکی خۆش."

"بەڵام دەرگاوانەکە پێی وتم لێرە ئەژی!"

بەم شێوەیە سەردانکەرەکە وای وت، زۆر بەوریایی بەرەو لای دەرگاکە دەکشایەوە.

"فەرموون، فەرموون، برا گچکە؛ لێرە برۆن!"

دەستبەجێ ڕۆژی دوای ئەوە، پاش نانی شێوان، لە کاتێکدا ئاستافی ئەو پاڵتۆیەی بۆ هێنامەوە کە بردبووی بۆم بدوورێتەوە، جارێکی تریش گوێبیستی دەنگێکی نامۆ بوومەوە لەناو داڵانەکەدا. دەرگاکەم کردەوە. بەڵام چی ببینم! هەمان ئەو پیاوە بوو، کە ڕۆژی پێشتر هاتبوو، بەهێواشی و لە بەرچاوی خۆم چاکەتەکەمی لەسەر ڕەفەکە داگرت، کردییە بنباڵییەوە و بە خشکەیی بۆی دەر چوو.

لە تەواوی ئەوکاتەدا ئەگرافینا لەناو دەرگای موبەقەکە بەپێوە وەستابوو، بە دەمی داچەقیو و واقی وڕماوەوە تەماشای کابرای دەکرد، وا دەر دەکەوت توانای ئەوەی نەبوو بێت لە شوێنی خۆی ببزوێت و پاڵتۆکە ڕزگار بکات.

بەڵام ئاستافی ئیڤانیچ بەخێرایی شوێن دزەکە کەوت، بەڵام پاش ماوەیەکی کورت، بە هەناسەبڕکێ و شەکەتی و دەستی خاڵییەوە گەڕایەوە. دزەکە لە چاوتروووکانێکدا دیار نەما، وەک ئەوەی زەوی قووتی دابێت.

وتم:

"بەڕاستی ئەمە شتێکی زۆر خراپە، ئاساتافی ئیڤانیچ. ئەوەی باشە پاڵتۆیەکی ترم هەیە، ئەگینا ئەو چەپەڵە هەر بەیەکجاری ڕەنجەڕۆی ئەکردم."

بەڵام ئاستافی، وا دیار بوو ئەوڕووداوە زۆر کاری تێ کردبێت، کاتێک لێی ورد بوومەوە، هەرچی سەبارەت بە دزییەکە بوو، لەبیرم چووەوە. نەیئەتوانی خۆی هێمن بکاتەوە. ڕووداوەکە زۆر کاری تێ کردبوو. هەر تاوناتاوێک دەستی لە کارەکەی هەڵدەگرت و سەرلەنوێ دەستی دەکردەوە بە باسکردنی ئەوەی چۆن هەموو شتێک ڕووی دا، لە چ شوێنێکدا ڕاوەستابوو، لە کاتێکدا تەنها دوو هەنگاوێک چاکەتەکەم لێوەی دوور بووە و چۆن لە بەرچاویدا دزراوە، وە تەنانەت چۆن دەستەوسان بووە لەوەی دزەکە بگرێت. پاشان دووبارە بێدەنگ دەبۆوە و سەرلەنوێ دەستی دەکردەوە بە کارەکەی، پاش تۆزێک ئەوەستا و سەرلەنوێ وازی لە کارەکەی ئەهێنایەوە، چاوم لێی بوو چووە خوارەوە بۆ لای دەرگاوانەکە، تا

پێی بڵێت چی ڕووی داوە، سەرزەنشتی بکات لەسەر ئەوەی بەپێی پێویست ئاگاداری خانووەکە نابێت، هەر دزێک بیەوێت، ئەتوانێت بەئاسانی هەستێت بە کاری دزیکردن لەم ماڵەدا. پاشان گەڕایەوە و دەستی کرد بە لۆمەکردنی ئەگرافیناش. پاشان سەرلەنوێ دەستی بە کارەکەی دەکردەوە و لەژێر لێوەوە بۆ ماوەیەکی درێژ هەر خەریکی بۆڵەبۆڵ بوو... چۆن دەکرێت شتی وا ڕوو بدات... "ئەو لێرەدا بوو... منیش ڕێک لەوێدا بووم... لە بەرچاومدا بوو، هەمووی دوو هەنگاوێک لێمەوە دوور نەبوو، کەچی زۆر بەئاسانی توانی چاکەتەکە ببات و بەئاسانی خۆی قوتار بکات لەدەستم... ئیتر بەم شێوەیە هەر بەردەوام بوو لەم بۆڵەبۆڵە لەژێر لێوەوە. زۆر بەکورتی، لەگەڵ ئەوەی ئاستاقی ئیڤانۆڤیچ دەیزانی چۆن هەستێت بە ڕاپەڕاندنی هەندێک کار، بەڵام لەسەر شتی پڕوپووچ زۆر دەڕۆیشت.

ئێوارە، لە کاتێکدا چاییەکم پێشکەش دەکرد، پێم وت:

"ئەزانی ئاستاقی ئیڤانۆڤیچ، ئەو دزە چاک خۆی لەدەستمان قوتار کرد."

خۆی لە ڕاستیدا من بەم قسەیە ئەمویست وای لێ بکەم، کە دووبارە چیرۆکی چاکەتە دزراوەکەم بۆ بگێڕێتەوە. ئەم چیرۆکە بە هۆی ئەوەی کە ئەونە

گیرابوویـەوە، شـێوەیەکی زۆر پێکەنینئامێـزی وەرگرتبـوو.

"بەڵـێ، خۆی قوتـار کرد لەدەستمان، گەورەم. بەڕاستی ئـەو ڕووداوە منـی زۆر تـووڕە کـرد، هەرچەنـدە ئـەوەی دزرا، موڵکـی منیش نەبـوو، هـەر لەبـەر ئەمـەش پێـم وایـە هیـچ شـتێک لـەم دنیایە هێندەی مرۆڤی دز چەپەڵ و ناحـەز نییـە. ئـەوان ئـەو شـتانەت لـێ ئـەدزن، کـە تـۆ بـە ئارەقـەی ناوچاوانـت ڕەنجـت لەگەڵـدا کێشـاوە بـۆ بەدەسـتهێنانی... کاتێـک و وزەیەکـی زۆرت بـەکار بـردووە بـۆی... چەنـد بوونەوەرێکـی قێزەونـە! کـە بیـری لـێ دەکەمـەوە، هەسـت بـە تەنگەنەفەسـی دەکـەم، هەسـت ئەکـەم خەریکـە ئەخنکێـم... ئـۆف! هەسـت بـە تورەیییەکـی زۆر دەکـەم... بـەڵام پێـم بڵـێ، گـەورەم؛ تـۆ وا دەر ناکەویت هـەر بەداخیش بیت بـۆ ئـەو شـتەی لەدەسـتت داوە؟"

"بـۆ نـا، ئاسـتافی ئیڤانیـچ؟ مرۆڤ پێـی خۆشـە شـتەکانی بـە دەسـتی خـۆی بسـووتێنێت، وەک لـەوەی بهێڵێـت دزێـک بێـت و بیاندزێـت. بەڕاسـتی ئەمـە بێزارکـەرە، مـرۆڤ تـووڕە دەکات!"

"وایـە، ڕاسـت دەکەیـت، ئەمـە بەڕاسـتی بێزارکـەرە، شـتێکت هەبێـت و لێـت بدزن. بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا، دز تـا دز کەوتـووە... بـۆ نموونـە، گـەورەم، جارێکیـان مـن بـە هـۆی ڕووداوێکـەوە دزێکـی ڕاسـتگۆم ناسـی."

"چـۆن شـتی وا دەبێـت؟ دزێکـی ڕاسـتگۆ؟ ئاسـتافی

ئیڤانیچ، چۆن دەکرێت دزێک ڕاستگۆ بێت؟"

"بێگومان گەورەم. قسەکەی بەڕێزتان دروستە، دزێک ناتوانێت مرۆیەکی ڕاستگۆ بێت. هەرگیز شتی وا نەبووە... بەڵام من تەنیا ویستم بڵێم ئەو بەڕاستی مرۆیەکی ڕاستگۆ بوو، یان بڵێین ئەو لە ڕوانگەی منەوە وا دەر دەکەوت، سەرباری ئەوەی دزیشی کرد. بەڕاستی زۆر بەزەییم پێیدا دەهاتەوە."

"ئاستافی ئیڤانیچ، ئەتوانیت بۆم باس بکەیت ئەمە چۆن ڕووی دا؟"

"ڕێک دوو ساڵ بەر لە ئێستا ڕووی دا. لەو کاتەدا بوو، کە من کاری خزمەتکاریم دەکرد، ئەو بارۆنەی من خزمەتم دەکرد، پێشبینی ئەوەم لێ کردبوو بەو زووانە کۆشکەکەی بەجێ دەهێڵێت و دەڕوات بۆ سەر زەویوزارەکەی. بۆیە لێم ڕوون بوو، کە بەو زووانە بێکار دەبم. مەگەر هەر خودا بۆ خۆشی بزانێت کەی کارێکی ترم دەست دەکەوتەوە؛ بۆیە بەم شێوەیە ڕووی دا، ڕۆژێک خۆم کرد بە مەیخانەیەکدا و چاوم بە کەسێکی نائومێد و بەدبەخت کەوت بە ناوی "ئیمیلیان" کاتی خۆی بۆ ماوەیەک لێرەولەوێ خزمەتی کردبوو، بەڵام بە هۆی ئەوەی هەمیشە سەرخۆش بووە و ئالوودە بووە بە مەیخواردنەوەوە، هەر لەبەر ئەوە لەسەر کارەکەی دەر کرابوو. چ بوونەوەرێکی لێنەهاتوو و بێکەڵک بوو!

هەرچییەکی بەردەست بکەوتایە، لەبەری دەکرد. هەندێک جار تەنانەت سەرم لەوە سوور دەما و لە خۆم دەپرسی، تۆ بلێی لەژێر ئەو پاڵتۆ شڕەیدا کراسێکی لەبەردا بێت؛ هەرچییەکی بەردەست بکەوتایە و دەستی پێ ڕابگەشتایە، ئەوە بێ یەک و دوو دەیفرۆشت و پارەکەشی دەدا بە مەی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو کەسێکی ئاژاوەچی نەبوو. ئۆو... نەخێر... ئەو بەڕاستی کەسێکی خوێنشیرین، ڕێکوپێک، زۆر میهرەبان و زۆر خۆشەویست بوو لای هەمووان. هەرگیز داوای هیچ شتێکی لە هیچکەس نەدەکرد. بۆیە ئەگەر مرۆڤ ویژدانی زیندوو بێت... ببینێت کەسێکی هەژار بۆ چۆڕێک مەی خەریکە گیانی دەر دەچێت، ئی گومانی تێدا نییە بێ ئەوەی خۆشی داوای بکات، هەستی مرۆڤبوونت پاڵت پێوە دەنێت بۆی بکڕیت. ئا بەم شێوەیە بووین بە هاوڕێ، ئەویش خۆی کز کردەوە، هەر وەک چۆن توولەیەک کە خواردنی بدەیتێ، ئیتر ئەکەوێتە کلکە لەقێ بۆت و بۆ هەرشوێنێک بڕۆیت، شوێنت دەکەوێت، ئەویش وەک توولەیەک بۆ هەرشوێنێک بڕۆشتمایە، شوێنم دەکەوت. هەموو ئەمانەش تەنها دوای یەکەم یەکتربینینمان ڕووی دا.

"بەدڵنیاییەوە، ئەو شەوە لەلام مایەوە؛ چوونکە گوزەرنامەکەی هیچ کێشەیەکی تێدا نەبوو، خۆشی لە کەسێکی خراپ نەدەچوو. بەڵام شەوی دواتریش،

هەر ناچار بووم ڕێی پێ بدەم لام بمێنێتەوە... ڕۆژی سێهەمیش، تەواوی ڕۆژەکە بەپێوە لە نزیک پەنجەرەکە وەستابوو، ماڵەکەی بەجێ نەهێشت و بەدڵنیاییەوە ئەو شەوەش هەر مایەوە. ئێ منیش بیرم دەکردەوە و لە دڵی خۆمدا دەموت، 'سەیر کە، چۆن ئەم کەسە زۆری لە خۆی کردووە و هانای بۆ تۆ هێناوە. پێویستە لەسەرت خواردن و خواردنەوەی پێشکەش بکەیت و لای خۆت داڵدەی بدەیت. هەموو ئەو شتەی ئەو پیاوە هەژارە پێویستیەتی، کەسێکە کە دەردەدڵی لەگەڵدا بکات'. هەر زوو بۆم دەر کەوت کە پێشتریش خۆی کۆ کردبۆوە و چووبووە لای کەسێکی تر، هەر وەک چۆن ئێستا هاتبوو بۆ لای من؛ بەیەکەوە خواردبوویانەوە. بەڵام ئەو کەسەی تر بە هۆی ڕووداوێکی تەمومژاوی و پڕئازارەوە گیانی سپاردبوو.

"من بیرم دەکردەوە و بیرم دەکردەوە، بە خۆم ئەوت 'چ شتێک پێویستە بیکەم لەگەڵیدا، تاکوو لە خۆمی دوور بخەمەوە و ئیزنی بدەم.' بەڕاستی ئەمویست لە خۆمی دوور بخەمەوە... بەڵام ویژدانم ڕێی پێ نەدەدام. زۆر بەزەییم پێیدا دەهاتەوە، 'ئەو چ بوونەوەرێکی بەدبەختە، غەمگینە. زۆر نەگبەتیشە! ئەو گەمژەیە خۆ بشمرێت، داوای هیچ شتێک لە هیچ کەسێک ناکات، تەنها بەهێمنی دادەنیشێت و ڕاستەوخۆ لە چاوانت دەڕوانێت. ڕێک

وەک توولەسەگێکی بەئەمەک، کە بڕوای تەواوی بە خاوەنەکەی هەیە و بە چاوی پڕبەزەییەوە ئەڕوانێتە چاوی خاوەنەکەی. ئا بەم شێوەیە، خواردنەوە ئەتوانێت پیاو لە بن بهێنێت'.

"بۆیە بە خۆمم ئەوت، 'باشە، گریمان وا پێشم وت ئیمیلیان، لێرە بچۆرە دەرێ؛ تۆ هیچ شتێک، هیچ کارێکت نییە لێرە تا بیکەیت، تۆ بۆ لای کەسێکی هەڵە هاتووی؛ بەم زووانە هیچ شتێکم نامێنێت تاکوو خۆشم بیخۆم، ئیتر چۆن پێت وا ئەبێت خواردنێک هەبێت دەرخواردی تۆی بدەم؟' هەوڵم دەدا بیهێنمە پێش چاوی خۆم، کە دەبێت چی بکات دوای ئەوەی هەموو ئەم شتانەی پێ دەڵێم.

"ئەمتوانی ئەو دیمەنە ببینم، کاتێک بۆ ماوەیەکی درێژ لێم دەڕوانێت و دوای ئەوەی گوێبیستی هەموو شتێک دەبێت لە من، بێ ئەوەی لە تەنها وشەیەکیش تێگەیشتبێت؛ لە کۆتاییدا نازانم ئەو چۆن لەمە تێدەگات، کە من ئەمەوێت لێی، ئەمهێنایە پێش چاوی خۆم، 'کە چۆن لە شوێنی دانیشتنی بەردەم پەنجەرەکەوە هەڵدەستێت و دوای ئەوەی تێدەگات لەوەی کە وتم، پریاسکە بچکۆلەکەی هەڵدەگرێت و ئێستاش هەر ئەڵێی لەپێش چاومدایە و ئەیبینم... پریاسکەیەکی چڵکن و پڕ لە کون بوو، چوارگۆشەی سووری تێدا بوو، هەمیشە

لەگەڵ خۆیدا هەڵی دەگرت بۆ هەرشوێنێک بڕۆشتبا، لەبەر چ هۆکارێک هەڵی دەگرت، مەگەر بەس خودا بۆ خۆی بزانێت بۆچی، ئەمهێنایە پێش چاوی خۆم، کە پاڵتۆ دڕاوەکەی ڕێکوپێک ئەکات، بۆ ئەوەی تۆزێک لەبەریدا ڕێکوپێکتر دەر کەوێت و هەروەها بۆ شاردنەوەی ئەو هەموو کونەشی کە لە پاڵتۆکەیدا بوو، چونکە ئەو بەڕاستی مرۆڤێکی زۆر هەستناسک بوو! ئەمهێنایە پێش چاوم، کە چۆن دەرگاکە دەکاتەوە و پاشان فرمێسک لە چاویدا قەتیس دەمێنێت، ئاوڕم لێ ئەداتەوە و بە چاوی گریانەوە بەرەو دەرەوە دەڕوات.

"باشە، دەکرێت ڕێ بە پیاوێک بدرێت، تا بەتەواوی لەناو بچێت؟ بۆیە لە ناخی دڵمەوە بەزەییم پێیدا هاتەوە؛ بەڵام لە هەمان کاتا بیریشم لەوە دەکردەوە و دەمگوت، 'باشە ئەی خۆم چی؟ ئایا دۆخی من لە دۆخی ئەو خراپتر نییە؟' بۆیە بە خۆمم وت:

'زۆر باشە، ئیمیلیان، پێناچێت بۆ ماوەیەکی درێژتر بە میوانی لەلای من بمێنێتەوە؛ بەم زووانە خۆشم دەبێت ئێرە بەجێ بهێڵم، ئیتر بەم شێوەیە جارێکی دی ناتوانێت من بدۆزێتەوە. بەڵێ، گەورەم، بارۆنەکەم هەر زوو بەرەو زەویوزارەکەی ڕۆشت، لەگەڵ خۆشیدا سەرجەم دانیشتووانی ماڵەکەشی برد، ئەو پێش ئەوەی بڕوات، پێی ڕاگەیاندبووم کە زۆر بەباشی ڕازی بووە

لە خزمەتەکانم، بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە دوای ئەوەی ئەگەڕێتەوە بۆ پایتەخت، ئەمخاتەوە سەر کارەکەی خۆم. بارۆنەکەم چەند پیاوێکی باش بوو، بەڵام هەر هەمان ساڵ گیانی سپارد.

"بەڵێ، دوای ئەوەی هاوەڵی بارۆنەکەم و خێزانەکەیم کرد و بەڕێم کردن، کەلوپەلەکانم کۆ کردەوە و لەگەڵ ئەو برەپارە کەمەی پاشەکەوتم کردبوو، ڕۆشتم تا لەگەڵ ئەو پیرێژنە بژیم، کە پێشتر ئەمناسی، سووچی ئەو ژوورەم لێ بەکرێ گرت، کە خۆی بۆی خاڵی کردبووم. ئەو خانمە پیرە پێشتر وەک دایەن لای هەندێک ماڵی دەوڵەمەند کاری کربوو، بەڵام بە هۆی ئەوەی چووبووە تەمەنەوە، خانەنشینیان کردبوو.

"بۆیە بە خۆمم وت، 'زۆرباشە' خودات لەگەڵ ئیمیلیان، ئەی هاوڕێکەم، ئێستا چیدی ناتوانیت بمدۆزیتەوە...! بەلام بڕوا ئەکەیت، گەورەم؟ کاتێک لای ئێوارە کە لە سەردانی یەکێک لە ناسیاوەکانم بووم، کە برێک پارەم لا بوو ئەبووایە بمدایەتەوە، بەلام کە گەڕامەوە، کێ ببینم و چی ببینم! ئیمیلیانم بینی! بڕوام بە چاوی خۆم نەدەکرد، بەهێمنی لەسەر سندوقەکەم دانیشتبوو، ئەو پڕیاسکە چلکنەش کە چوارگۆشە سوورەکانی تێدا بوو، لەتەنیشت خۆیەوە دای نابوو. خۆی لە پاڵتۆ هەژارانە شڕۆلەکەیدا پێچابووەوە و چاوەڕوانی هاتنەوەی من بوو بۆ ماڵەوە.

پێدەچوو تەواو هەستی بە بێزاری و تەنیایی کردبێت، هەر لەبەر ئەوە کتێبێکی وێردخوێندنی بە قەرد لە پیرێژنەکەی خاوەنماڵم وەرگرتبوو. بەڵام ئەوەی مایەی پێکەنین بوو، ئەوە بوو، کتێبەکەی هەڵاوگێڕاو گرتبوو بە دەستیەوە. لە کۆتاییدا شاد بوو بە گەڕانەوەی من!

"من کە ئەوم بینی، دەمم داچەقی و بە هەردوو دەستی کراوەوە و بە سەرسوورمانەوە، بە خۆمم وت، 'ئاستاڤی، ڕێگەی دەربازبوونت نییە لەم کابرایە...! باشە بۆ هەر لە سەرەتاوە دەرم نەکرد و هەموو شتێک کۆتایی پێ بهێنم؟ باشە ئەو بێدەماغییە چی بوو، کە کردم و وتم گوزەرنامەت پێیە، ئیمیلیان؟'

"جا بەم شێوەیە کە بۆتان دەگێڕمەوە، گەورەم، دانیشتم و بۆ تاوێک دەستم کرد بە بیرکردنەوە و تاووتوێکردنی ئەم ئاریشەیە لە مێشکی خۆمدا؛ ئەوپرسیارەم لە خۆم کرد: ئایا بەڕاستی ئەم گەمژەیە بەو شێوەیە بۆتە هۆی ئەوەی جێگە بە من لێژ بکات؟

"پاش ئەوەی بەباشی هەڵسەنگاندنم بۆ کێشەکە کرد، گەیشتم بەو بڕوایەی کە لە ڕاستیدا هەبوونی ئەو لێرە یەجکار بەو شێوە بێزارکەرەش نییە. بگرە بۆ هاودەمیش کەسێکی خراپ نییە."

"بەڵێ، بێگومان، بە خۆمم وت: (ئەو تەنها پێویستی بە بڕێک خواردنە بەڵام بڕی ئەو خواردنە چەندە، کە

ئەو ئەیخوات؟ هەندێک نان لە بەیانیاندا لەگەڵ تۆزێک پیازدا، بۆ ئەوەی تۆزێک تاموچێژ بدات بە خواردنەکە، یان هەرشتێکی تر، ئەگەر هەبوو. بۆ نیوەڕوانیش، هەر بە هەمان شێوە هەندێک نان و پیاز، بۆ ئێوارەش، پیاز و نان لەگەڵ هەندێک مەی لە جۆری "کەڤاس" ئەگەر بەڕێکەوت ئێوارەیەکیش هەندێک شۆرباى کەللەرممان هەبوو، بەم شێوەیە هەردووکمان تا بینەقاقامان پڕ دەکەین لە خواردن و خواردنەوە. من خۆم کەسێکی زۆر کەمخۆرم، ئێ ئیمیلیانیش لەبەر ئەوەی کەسێکی مەیخۆرە، ئەوە ئەگەر خواردنیش بخوات، بە دڵنیاییەوە بڕێکی زۆر کەم دەخوات، ڕەنگە هەر نەشیخوات، ئەو بەس ڤۆدگای هەبێت، هیچی تری ناوێت. بەڵام بە خۆمم ئەوت، 'وا بڕوات، خۆی بە مەیخواردنەوە لەبن دێنێت'. بۆیە ئەو بیرۆکەیە خۆی خزاندە مێشکمەوە و بە خۆمم وت: 'باشە ئەگەر بەرپرسیارێتی ژیانی ئەم کابرایە بە جۆرێک لە جۆرەکان لەسەر شانی من بێت و ئیمیلیان بەم دۆخەی ئێستایەوە بمرێت، ئەوە هەرگیز ناتوانم لە خۆم خۆش بم، بۆیە پێویستە من هاوکاری بکەم. بڕیارم دا لەمەودوا وەک باوکێکی خۆبەخش بم بۆی. ئەبێت بیخەمەوە سەر پێیەکانی خۆی، ئەبێت لەم ئالوودەبوونەی ڕزگاری بکەم، ئەبێت وای لێ بکەم، مەیخواردنەوە وەلا بنێت و خۆی بە شتی بەسوودەوە خەریک بکات لەبری مەیخواردنەوە'.

لە دڵی خۆمدا وتم' تەنیا کەمێک چاوەڕێ بکە، ئیمیلیان... دەبینیت... چۆن ڕۆح دەکەمەوە بە بەرتدا دووبارە، وات لێ دەکەم ژیان واتایەکی نوێی هەبێت لەلات.

"بۆیە وتم پێی ئەڵێم، ' زۆر باشە، ئیمیلیان. لەگەڵ من بمێنەرەوە، بەڵام لەمڕۆ بەدواوە، پێویستە گوێڕایەڵی فەرمانەکانم بیت!'

"بەڵێ، بیرم کردەوە و بە خۆمم وت، هەندێک کاری فێر دەکەم، بەڵام یەکسەر نا، ڕێی ئەدەم سەرەتا هەندێک کەیف و شادیی خۆی بکات، منیش هەوڵ ئەدەم لەو ماوەیەدا کە لێرەیە، ئەگەڕێم تا بزانم چ کارێک ئاسان و گونجاوە و لەگەڵ توانای ڕاستەقینەی ئەودا یەک دێتەوە و لە عۆدەی دێت.

"لەبەر ئەوە، گەورەم، پێویستە ئەوە بزانن، کە پیاو ئەبێت تواناکانی گونجاو بێت بۆ ئەو کارەی دەتانەوێت بۆتان ئەنجام بدات... چونکە ئەگەر بەپێچەوانەوە بێت، ئەنجامەکەی نەکردنی کارەکە دەبێت، یاخود کارەکە بە ڕێکوپێکی و بەپێی ئەوە ناچێت بەڕێوە، کە تۆ چاوەڕوانی دەکەیت. هەر لەبەر ئەم هۆکارە، بە شێوەیەکی نهێنی بێ ئەوەی خۆی ئاگادار بێت کە چاوەدێریی دەکەم، دەستم کرد بە سەرنجدان و لێکۆڵینەوەیەکی ورد لەسەر سەرجەم هەڵسوکەوت و جموجووڵەکانی. بەڵام بڕوا بکەن گەورەم، ئەو ئیمیلیانە کەسێکی زۆر بێهیواکەر بوو! لە

سەرەتادا هەوڵم دا بە قسەی نەرم و خۆش بیهێنمە ژێر بار. بەم شێوەیە من هەر بەردەوام بووم لەگەڵیدا، بە پیشەکەشکردنی ئامۆژگاریی بەسوود و وتەی باش. پێم دەوت، 'گوێ بگرە، ئیمیلیانی ئازیز، پێویستە تۆزێک بیر لە خۆت بکەیتەوە... تۆزێک گرنگی زیاتر بە خۆت بدەیت... پێویستە کارێک بکەیت، دەست لەم تەمەڵییەت هەڵگرە، باشترە تۆزێک خۆت کۆ بکەیتەوە، دەستێک بە خۆتدا بهێنە، واز لەم مەیخواردنەوەیە بهێنە. توو خوا تەماشای خۆتت کردووە، شڕوشیتاڵت هاتۆتە دەرێ. تەماشای پاڵتۆ دڕاوەکەت کردووە، لە بێژنگ نەبێت لە هیچی دی ناچێت! ئەمە شتێکی باش نییە، هاوڕێکەم، نازانم کەی هێیتەوە هۆشی خۆت و تۆزێک بیر لە خۆت ئەکەیتە و بە خۆتا ئەچیتەوە و واز لەم بێسەروبەرەییەکەی ئێستات دەهێنیت. بۆیە پێم وایە ئیتر کاتی ئەوە هاتووە، دەستێک بەسەر بارودۆخی خۆتدا بهێنیت."

"ئیمیلیان"ی بەدبەخت سەری خۆی داخستبوو، بەوردی گوێی لە وردودرشتی قسەکانم گرتبوو بێ ئەوەی چرکەی لێوە بێت. هاوڕێ چارەڕەشەکەم کاتێک مەی تەواو کاریگەریی خۆی لەسەر دادەنا و مەستی دەکرد، چیتر زمانیشی لە گۆ دەکەوت و تاقە وشەیەکیش چییە، بەجوانی نەیئەتوانی دەری ببڕێت. بۆ نموونە، کاتێک تۆ باسی خەیارت بۆ دەکرد، ئەو لە وەڵامدا دەیگوت

فاسۆلیا. گوێی لێ گرتبووم... گوێی لێ گرتبووم بۆ ماوەیەکی درێژ، پاشان ئاخێکی زۆر قووڵی هەڵکێشا...

لێم پرسی:

"بۆچی ئاخ هەڵدەکێشیت، ئیمیلیان؟"

"هیچ نییە، ئاستافی ئیڤانیچ، شتێکی هێندە گرنگ نییە، بۆیە خۆتان زۆر نیگەران مەکەن. تەنها لەبەر ئەو ڕووداوەیە، کە ئەمڕۆ بینیم، ئاستافی ئیڤانیچ، ئەمڕۆ دوو ئافرەت بوو بە شەڕیان لەسەر شەقامەکە. یەکێک لەو ئافرەتانە بێ ئەوەی مەبەستی بێت، سەبەتەتووتڕکەکەی ئەو ئافرەتەی تری قڵپ کردەوە، کە بەسەر شانیەوە بوو."

"ئێ پاشان چی ڕووی دا؟"

"پاشان ئەو ئافرەتەی سەبەتەتووتڕکەکەی کەوتبووە خوارەوە و تووتڕکەکەی پەرشوبڵاو ببۆەوە، بەزۆر پڕی کرد بە سەبەتە تووتڕکەکەی ژنەکەی تردا و لە دەستی هەڵپڕیوان، ئەو نەک هەر فڕێی دایە سەر عەردەکە، بەڵکوو هەمووشی بە پێیەکانی فلیقانەوە بەسەر یەکا."

"باشە، ئەمە چ گرنگییەکی هەیە، چ شتێکی تێدایە؟"

لە دڵی خۆمدا وتم " ئاخخ...! ئیمیلیانی بەدبەخت، وا بزانم بە هۆی ئەم مەیە نەفرەتییەوە ژیریی خۆشت لەدەست داوە!"

دووباره ئیمیلیان وتیەوە:
"هەروەها ئەمرۆ بارۆنێکیشم بینی، کە دراوێکی کاغەزیی لێ کەوت لەسەر شەقامی (گۆرۆخۆ... نا... نا... پێم وا بێت شەقامی سادۆڤا بوو...) جووتیارێک ئەو دراوە کاغەزییەی بینی، کە لە بارۆنەکە کەوت، وتی، "بەختی خۆم،" بەڵام لەولاوە جووتیارێکی تریش بینیبووی، وتی، نەخێر، ئەوە "بەختی منە! "چونکە من سەرەتا چاوم پێی کەوت، کە لێی کەوت..."
"زۆر باشە، ئیمیلیان، ئێ، چی ڕووی دا؟
"ئێ، ئاستافی ئیڤانیچ هەردوو جووتیارەکە کەوتنە سەروگوێلاکی یەکتری، بوو بە شەڕێک هەر مەپرسە... بەڵام پۆلیسێک کە لەو شوێنە نزیک بوو، ئەویش ئاگای لە ڕووداوەکە بوو، دراوە کاغەزییەکەی هەڵگرتەوە و گەڕاندییەوە بۆ بارۆنەکە، هەڕەشەشی لە هەردوو جووتیارەکە کرد، کە ڕاپێچیان دەکات بەرەو زیندان، لەسەر ئەوەی پشێوییان دروست کردووە لەسەر شەقامەکە."
"زۆر باشە، بەس پێم ناڵێیت ئەمە چ سوودێکی هەیە؟ ئەبێت چ گرنگییەک یان مەترسییەک هەبێت لەم باسەدا؟"
"ئێ هیچ شتێکی وەهای تێدا نەبوو ئاستافی ئیڤانۆڤیچ... بەڵام ئەو ڕووداوە بووە هۆی وەپێکەنینهێنانی خەڵکی ئەو گوزەرەی شەڕەکە تیا ڕووی دا."
"ئاخخخ... ئیمیلیان! باشە خەڵک کاریان چییە بەم

شتانەوە؟ تۆ ڕۆحی هەمیشەییت ئەفرۆشیت لەپێناو دروایکی ئاسنی بێبایەخدا. ئەزانی ئیمیلیان، ئەمەویت شتێکت پێ بلێم:"

"ئەتەویت چ شتێکم پێ بڵێیت، ئاستافی ئیڤانیچ؟"

"ئەمەویت پێت بڵێم کە باشترە خۆت خەریک بکەیت بە کارێکەوە... بەڕاستی لەسەرتە وا بکەیت. ئەمە بۆ سەدەمەمین جارە، کە پێت دەڵێم پێویستە هیچ نەبێت تۆزێک بەزەییت بە خۆتدا بێتەوە!"

"بەلام ئەبێت چ کارێک بکەم، ئاستافی ئیڤانیچ؟ نازانم لەکوێوە دەست پێ بکەم و هیچ کەسیش ئامادە نییە کارم بداتێ."

"ئاخر خۆت باشتر دەزانیت خەڵک بۆ ئامادە نییە کە کارت بداتێ! هۆکارەکەی ڕوونە، لەبەر ئەوەی جەنابت هەمیشە سەرخۆشیت و خەریکی خواردنەوەیت... ئێ خەڵکیش کەسێکی سەرخۆش بە چ دەردێکی ئەخوات."

بۆ ساتێک ئیمیلیان هیچی نەوت، بەلام لەپڕ دەستی کردەوە بە قسەکردن:

"بەم بۆنەیەوە، ئاستافی ئیڤانۆڤیچ، شتێکی ترم وەبیر هاتەوە، کە هەر ئەمڕۆ ڕووی دا؛ ئەمڕۆ "ڤلاس" خاوەنی

مەیخانەکەیان بانگ کرد بۆ بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس."

"بە چ هۆکارێک بانگیان کردبوو، ئیمیلیان؟"

"ڕاستییەکەی نازانم، ئاستافی ئیڤانیچ بۆ چی بانگیان کردبوو، بەلام پێم وایە پێویستیان پێی بووە، بۆیە بانگیان کردووە."

لە دلی خۆمدا وتم: ئاخ... هیچ شتێکی باش ڕوومان تێ ناکات، ئیمیلیان! ئەمە هەمووی باجی گوناهەکانمانە، خودا لەسەری سزامان دەدات!

گەورەم، تۆ پێم بلێ، باشە مرۆڤ ئەبێت چی بکات لەگەڵ مرۆڤێکی وەک ئیمیلیان؟

با پێت بلێم گەورەم، ئیمیلیان کەسێکی زۆر مەکرباز بوو...! گوێی لێ ئەگرتم، گوێی لێ ئەگرتم، هەتا ماندوو دەبوو، هەر تێبینی ئەوەی بکردایە کە خەریکە وردەوردە تووڕە دەبم، پالتۆ شڕەکەی ئەیا بە شانییا و ئەڕۆشت لە دەرەوە ئەخەوت... تەواوی ڕۆژەکەی لە دەرەوە بەسەر دەبرد و نەئەگەڕایەوە بۆ مالەوە، هەتا ئەو کاتەی هەستی بکردایە تووڕەییەکەم دامرکاوەتەوە... ئنجا دەگەڕایەوە. سەر لە ئێوارانیش کە دەگەڕایەوە، وەک بەگزادەیەکی سەرخۆش دەگەڕایەوە بۆ مالەوە. بەلام لەوە تێنەدەگەیشتم چۆن مەیی دەست دەکەوت یان لەکوێوە پارەی دەست

دەکەوت مەی پێ بکڕێت، مەگەر هەر خودا بۆ خۆی بزانێت. چونکە بەدڵنیاییەوە من پارەم نەئەیا پێی، چونکە ئەمزانی گەر پارەی بدەمێ، ئەیدا بە مەی....!

پێم وت:

"باش گوێ بگرە ئیمیلیان، ئیتر پێویستە واز لە خواردنەوە بهێنیت. گوێت لێمە؟ پێویستە چیتر مەی نەخۆیتەوە و وازی لێ بهێنیت! جاری داهاتوو بەم سەرخۆشییە بگەڕێیتەوە، دڵنیا بە ڕێت پێ نادەم بییتە ژوورەوە! ئەبێت لەسەر قادرمەکان بخەویت."

دوای ئەمە بۆ ماوەی دوو ڕۆژ ئیمیلیان لە ماڵ وەدەر نەکەوت. بەڵام ڕۆژی سێیەم، خۆی بۆ نەگیرا و بەدزییەوە ڕۆشتبووە دەرەوە. ماوەیەکی زۆر چاوەڕێم کرد، هەر نەگەڕایەوە، زۆر چاوەڕێی گەڕانەوەی بووم، کەچی هەر نەگەڕایەوە! بە ڕاشکاوی دانی پێدا ئەنێم، کە جۆرێک لە ترس و دڵەخورپە دای گرتم؛ سەرەڕای ئەوەشی کە خەفەتێکی زۆرم بۆ ئەخوارد. بە خۆمم وت: ئەی هاوار، چیم کرد لەو بەدبەختە!

وا بزانم ئەو داماوەم ترساند، ئەو بوونەوەرە بەدبەختە ئەبێت بۆ کوێ چووبێت، ئێستا لەکوێ بێت؟ خوای گەورە. تۆ بڵێی هیچی لێ بەسەر نەهاتبێت تا

ئیستا! ئەو شەوەش ڕای بورد و ئەو هەر نەگەڕایەوە.
سەرلەبەیانی کە لە ژوورەکەم وەدەر کەوتم و خۆم کرد
بە هۆڵەکەدا، تەماشام کرد لەوێ ڕاکشابوو، خەوی لێ
کەوتووە و سەریشی لەسەر پلەی یەکەمی قادرمەکانی
هۆڵەکە دانابوو، خەریک بوو ڕەق هەڵدەهات لە سەرمادا.
"چیت لێ بەسەر هاتووە، ئیمیلیان؟ خوا بتپارێزێ!
ئەی لێرەدا چی دەکەیت، بۆ نەهاتوویتەتە ژوورەوە؟"
ئیمیلیان وەڵامی دامەوە و وتی:
"ئاستافی ئیڤانیچ، تۆ چەند ڕۆژێک لەمەوبەر زۆر
تووڕە بوویت لێم، بە هۆی ئەوەی تۆم جاڕز کرد، تۆش
پەیمانت دا کە ئەگەر ئەمجارە بە سەرخۆشی بگەڕێمەوە،
ئەبێت لە هۆڵەکە و لەسەر قادرمەکان بنوم. بۆیە من...
منیش... نەموێرا بێمە ژوورەوە... هەر لەبەر ئەوە لێرەدا
لێی ڕاکشام."

بە دەنگێکی پڕ لە تووڕەیی و لە هەمان کاتا پڕ لە
بەزەییش، بە ئیمیلیانم وت:

"باشترە بچیت کارێک بۆ خۆت پەیدا بکەیت، نەوەک
ئا لێرەدا دانیشیت و بێسوودانە لەم قادرمانە بڕوانیت!"
"بەڵام چ کارێک، ئاستافی ئیڤانۆڤیچ؟"

کە گوێم لەم وەڵامە ناقۆڵایەی ئیمیلیان بوو، وەخت بوو لە تووڕەییدا شەق بەرم.

پێم وت:

هەی بەدبەخت، بۆ هەوڵ نادەیت خۆت بە شتێکی بەسوودەوە خەریک بکەیت، هیچ نەبێت خۆت فێری هونەری دروومان بکە. تەماشایەکی ئەو پاڵتۆیەی خۆت بکە، کە لەبەرتدایە! نەک هەر پڕە لە کون، بەڵکوو بەکەڵکی ئەوەش نەماوە ئەو قادرمانەشی پێ گسک بدەیت! هیچ نەبێت دەرزییەک هەڵبگرە و تۆزێک بیدوورەرەوە، خۆ هیچ نەبێت تۆزێک ڕەنگ هەڵدەهێنێتەوە و ڕووی ئەوەی دەبێت بڵێی پاڵتۆم لەبەردایە. هەی بەدبەخت... هەی سەرخۆشی نابوت... تۆ ئەڵێی لە مەیخواردنەوە زیاتر، هیچ شتێکی تر نازانیت لەم دنیایە!"

ئەزانی چی گەورەم، خۆزگەم لەوێ بوویتایە و ئەو دیمەنەت بە چاوی خۆت ببینیایە کە ڕووی دا! پاش ئەوەی قسەکانم تەواو کرد، چوو دەرزییەکی دروومانی هێنا... من هەر بۆ خۆشی وام پێ وت، بەڵام ئەو چارەڕەشە بەڕاستی ترسا و ڕێک دەرزیی دروومانی هێنا، بۆ ئەوەی پاڵتاوە شڕەکەی بدوورێتەوە. بۆیە پاڵتاوەکەی لەبەری خۆی داکەند و دەرزییەکەشی بە دەستەوە بوو هەوڵی ئەوەی ئەدا دەزووەکە بکات بە

کونی دەرزییەکەدا، دیمەنێکی زۆر پێکەنیناوی بوو، ئەگەر ئەتبینی چون چاوەکانی ورد وردە سوور هەڵدەگەڕان و دەستیشی وەک شەقشەقە دەلەرزی! زۆر هەوڵی ئەوەی ئەدا دەزووەکە بکات بە کونی دەرزییەکەدا، هەر بۆی نەدەچووە ناوەوە، سەری دەزووەکەی بە دەم تەڕ دەکرد و لەناو پەنجەکانیدا هەڵی ئەسووڕاند و لووسی دەکرد و هەولی دەدا بیکات بە دەرزییەکەدا، بەڵام ئەو داماوە هەر سەرکەوتوو نەدەبوو، بۆی نەدەکرایە ناوی، هەوڵەکانی هەمووی بێسوود بوون! بۆیە فڕێی دا و لە ژێریشەوە تەماشای منی دەکرد.

بە ئیمیلیانم وت:

"ئەوە چی ئەکەیت! من هەموو ئەو قسانەم تەنها بۆ خۆشی پێ وتیت، لەبەر ئەوەی کەمێک توورە بووم لێت. ئەگەر بهاتایە خەڵک ئەمەیان ببینیایە، ئەوە لە شەرمەزاریدا ئەمردم! واز لە درۆمان بهێنە؛ خوا لە گوناح بەدوورت بکات! پێویست ناکات هیچ کارێک بکەیت، بەس تکایە، واز لە گەوجێتی بهێنە، هەروەها لەمڕۆش بەدواوە لەسەر قادرمەکان مەنو، بەم کارەت شەرمەزارم مەکە!"

"بەڵام دەبێت چی بکەم، ئاستافی ئیڤانیچ، خۆشم ئەزانم من هەمیشە مەستم، ئەزانم کەڵکی کردنی هیچ کارێکم نییە! بڕوا بکە بەس بەوە ناڕەحەت دەبم، کە ببمە

هۆکاری تووڕەبوون و بێتاقەتیی تۆ... چونکە بەڕاستی تۆ کەسێکی بەخشندە و دڵۆڤانی."

لەپڕ لێوە شینهەڵگەڕاوەکانی کەوتە لەرزین و لە پرمەی گریانی دا و فرمێسک بە چاوەکانیدا جۆگەلەی بەست و بەسەر ڕوومەتە زەردهەڵگەڕاوەکانی و ڕیشە نەتاشراوەکەیدا هاتە خوارەوە، فرمێسک لە چاوەکانیدا ڕانەدەوەستا، هەر فرمێسکێکی، هەڵگری ئازاری پیاوێکی تێکشکاو بوو، کە دەکەوتە سەر زەوی... ئیمیلیانەکەم... خوایە گیان! کاتێک بەو شێوەیە بینیم، کسپە لە جەرگمەوە هات، ئەتوت خەنجەر لە دڵم دەچەقێنن.

"ئاخخ، ئەی پیاوی دڵناسک؛ من هەرگیز بیر ناکەمەوە! ئاخر کێ بیر لە شتی وا دەکاتەوە! نەخێر، پێم باشە بەتەواوی وازت لێ بهێنم، چۆن دەتەوێت و خۆت حەز دەکەیت بژی، بەو شێوەیە بژی، کە دڵخۆشت دەکات."

بەڵێ گەورەم، ئیتر نازانم لەمە زیاتر چی ماوە بیڵێم! بڕوام وایە پێویست ناکات چیرۆکەکەم لەمە زیاتر درێژ بکەمەوە، چونکە چیرۆکەکە هەمووی قسەی بێمانایە، هیچ سوودێکی نییە، مرۆڤ بێهیوا دەکات. شتەکە هی ئەوە نییە پیاو تاقە وشەیەکی تریشی تیا بەفیڕۆ بدات؛ هەر بۆ نموونە، گەورەم، بڕوام وایە خودی ئێوەش ئامادە نین چیرۆکی لەم جۆرە، دوو قرووشیشی پێ بدەن، بەڵام بۆ

خۆم ئامادەم پارەیەکی زۆر بدەم بە چیرۆکگەلێکی لەم جۆرە.

بڕوا بکەن گەورەم، ئەگەر من پارەیەکی زۆرم هەبووایە، نەمدەهێشت هەرگیز ئەم شتە ڕوو بدات! گەورەم، ئەزانی چی؟ من دوو پانتۆڵم هەبوو، کە قوماشەکەی چوارگۆشەی شینی تێدا بوو... نەفرەتی خوا لەو پانتۆڵانە...

دوو پانتۆڵی زۆر نایاب بوو... خاوەنزەوییەکی دەوڵەمەند، کە بە هۆکاری بازرگانی هاتبوو بۆ ئێرە، داوای پانتۆڵەکانی لێ کردم. منیش پانتۆڵەکانم پێ دا، بەڵام کاتێک چووم بۆ ئەوەی نرخی پانتۆڵەکانم وەربگرم، پانتۆڵەکانی بۆ گەڕاندمەوە، بەو بیانووەی پانتۆڵەکان تەسک بوون بە بەری، بۆیە دایەوە بەسەرما.

بە خۆمم وت: ئەم جلانە لە جۆری پلەیەکن، زۆر نایابن! ئەتوانم بیبەم بۆ بازاڕی کۆنەکە و بۆ هەریەکێکیان، نزیکەی پێنج ڕۆبڵم لێ چنگ بکەوێت، ئەگەر بەو شێوەیەش بۆم نەفرۆشرا، بە مقەست دەیانبڕم و پاشان دوو پانتۆڵی تریان لێ دروست دەکەم بۆ هەندێک خانەدانی "ست. پترسبۆرگ،" هەروەها لەو سەرەپارچەیەشی کە لە دوو پانتۆڵەکە دەمێنێتەوە، هێلەکێکی بۆ خۆم لێ دروست ئەکەم. پیاوی هەژار دەبێت هەموو شتێک لە بەرچاو بگرێت و حساب بۆ هەموو شت بکات!

لەو کاتەدا ڕووی دا، کە ئیمیلیان لەوپەڕی بێزاری و نارەحەتیدا بوو، ڕۆژی یەکەم تەماشام کرد نەی خواردەوە، هەروەها ڕۆژی دووەم و سێهەمیش بە هەمان شێوە هەر نەیخواردەوە، زۆر پەست و غەمگین بوو.

بە خۆمم وت: "ڕەنگە ئەم هاوڕێ بەدبەختەم یان لەبەر بێپارەییە ناخواتەوە، یاخود لە کۆتاییدا هۆش خۆی هاتۆتەوە و گوێی لە ویژدانی خۆی گرتووە و ویژدانی پێی وتووە چیتر بەسە! ڕەنگە بەم شێوەیە ڕێگەی ڕاستی دۆزیبێتەوە!

بەم شێوەیە، گەورەم، بۆ ئەوەی ئەم چیرۆکە درێژەتان بۆ کورت بکەمەوە، ڕێک لەو کاتەدا جەژن هات، منیش ئەو ئێوارەیە بۆ نوێژخوێندن ڕووم کردە کەنیسەیەک. کاتێک گەڕامەوە، ئیمیلیانم بینی وەک بەگزادەیەک بە سەرخۆشی لە نزیک پەنجەرەکەوە لێی دانیشتووە و وەک داری بی، تەواوی جەستەی دەلەرزی.

لە دڵی خۆمدا وتم : "ئەها! کەواتە هیچ نەگۆڕاویت، چۆن بوویت هەر وایت".

ڕۆشتم بۆ لای سندوقی کەلوپەلەکانم، تا ئەو شتە دەر بهێنم، کە پێویستم پێی بوو. سەیرم کرد! پانتۆڵەکانی تێدا نەمابوو. ئەملام دا بە یەکا، ئەولام دا بە یەکا، پانتۆڵ لە هیچ شوێنێکدا نەبوو! دوای ئەوەی تەواوی ماڵەکەم پشکنی، بەلام پانتۆڵ لە هیچ جێگەیەک نەبوو ئەتوت

زەوی قوتی داوە! دواجار گەشتم بەو بڕوایەی پانتۆڵەکان دیار نەماون، بەلام چۆن دیار نەماون، نازانم! لەو کاتەدا خەنجەریان لی بدامایە، بە خۆمم نەدەزانی. خێرا چوومە ویزەی پیریژنەی داماو بۆ سەرکۆنەکردن و لۆمەکردنی ئەو داماوە، لەسەر دیارنەمانی پانتۆلەکان، لە کاتێکدا ئیمیلیانیش لەوێ بوو، سەرخۆشییەکەی بەلگە بوو لەسەر تاوانباریی ئەو، بەلام بە شێوەیەک لە شێوەکان هیچ گومانێکم لەو نەکرد. چونکە هەر بەڕاستی ئەقڵم نەیدەبڕی ئەو کارێکی لەو جۆرە دەرهەق بە من بکات!

پیریژنی داماو وتی:

"بۆ خاتری خوا، پیاوی بەڕێز، ئاخر پێم نالێیت من پانتۆڵی پیاوانەم بۆ چییە! ئایا ئەتوانم لەبەری بکەم؟ من خۆشم چاکەتێکم چەند ڕۆژێک لەمەوبەر دیار نەماوە. بڕوا بکەن من هیچ شتێک لەبارەی ئەم ڕووداوەوە نازانم."

پێم وت:

"ئایا هیچ کەسێک هاتووە بۆ ئێرە؟"

پیریژن وتی:

"کەس نەهاتووە، من تەواوی کات لە ماڵەوە بووم. تەنها هاوڕێکەت نەبێت، کە بۆ چەند ساتێک ڕۆشتە

دەرەوە و پاشان هاتەوە و لێرە دانیشت! ئەوە خۆیەتی، بۆچی پرسیاری لێ ناکەیت؟"

ئیمیلیان، ئایا بە هۆی هیچ هۆکارێکەوە نەبووە، یان بە هۆی هەرشتێکەوە ڕووی دابێت، کە پانتۆڵەکان لە سندوقەکەدا دەر بکەیت؟ بەتایبەتی ئەو دانەیەیان، ئەگەر بیرت مابێت، کە بۆ خاوەنزەوییەکەم دروست کردبوو؟"

ئیمیلیان وتی:

"نەخێر ئاستافی ئیڤانیچ، من دەستم بۆ نەبردوون."

بەخۆمم وت:

"باشە ئەم دوو پانتۆڵە چییان لێ هات؟"

سەرلەنوێ دەستم کردەوە بە گەڕان، بەڵام بێسوود بوو، چونکە نەمتوانی بیاندۆزمەوە!

ئیمیلیانیش لە شوێنەکەی خۆی، نزیک پەنجەرەکە، دانیشتبوو، گیانی ئەلەرزی.

لەسەر چۆک لەپێش سندوقەکەدا دانیشتبووم، ڕێک لە بەردەم ئەو. لەپڕ چاوم خستە سەر ئیمیلیان و تەماشام دەکرد، لە کاتێکدا ئاگای لە من نەبوو لێی دەڕوانم.

بە خۆمم وت: "خۆیەتی،" ئەمە هەر کاری ئیمیلیانە، لەو زیاتر کەس ئەم کارەی نەکردووە. دڵم خەریک بوو

ئاگری تێ بەر دەبوو، ڕووخسارم سوور هەڵگەڕابوو. ڕێک لەو کاتەدا ئیمیلیان سەری هەڵبڕی و تەماشای کردم، هەستی کرد گومانم لێیەتی.

وتی:

"نا، ئاستافی ئیڤانیچ، من پانتۆڵەکانی تۆم نەبردووە. ڕەنگە وا بیر بکەیتەوە، کە من پانتۆڵەکانم بردووە... بەلام بڕوا بکە من نەمبردوون."

"باشە ئیمیلیان، پێم بڵێ ئەم پانتۆڵانە بۆ کوێ چوون، وا لەپڕ دیار نەمان؟"

"نا، ئاستافی ئیڤانیچ، من هەر نەمبینیون..."

"چی دەڵێی ئیمیلیان، مەگەر ڕێی تێدەچێت ئەم پانتۆڵانە هەرلەخۆیانەوە ون بووبن؟"

"بۆ نا، ئاستافی ئیڤانیچ، لەوانەیە..."

دوای ئەوەی گوێم لەم وەڵامانەی ئیمیلیان بوو، یەک وشەی تر چییە بە خەسارم نەدا لەگەڵیدا. هەستامە سەر پێ و سەری سندوقەکەم کلۆم دا، دوای ئەوە، گلۆپەکەم داگیرساند، دانیشتم و دەستم بە کارکردن کرد. خەریکی چاککردنەوەی هێلەکێک بووم بۆ فەرمانبەرێکی میری، کە لە نهۆمی خوار خۆمان، لە باڵەخانەکەدا دەژیا. بەلام

بە شێوەیەکی زۆر ترسناک نیگەران بووم، زۆر ئەترسام ئەم هیلەکەش وەک پانتۆلەکان لەپڕ سەرنگوم بێت و ڕیسەکەم بکاتەوە بە خووری، کە بیرم لێ دەکردەوە، دڵم دەگوشرا، سینەم لە تووڕەییدا خەریک بوو ئاگری تێ بەر دەبوو. ئیمیلیان هەستی بەو تووڕەبوونە قووڵەی ناخم دەکرد.

گەورەم، هەمیشە بەم شێوەیەیە، کاتێک پیاو هەست بە تاوان ئەکات، هەمیشە پێشوەخت هەست بە ڕوودانی کارەساتێکی گەورە دەکات، کە بەسەریدا دێت، هەر وەک چۆن باڵندە پێشوەخت هەست بە ڕوودانی زریان دەکات.

لەناکاو ئیمیلیان دەستی پێ کردەوە:

"ئەزانیت، ئاستافی ئیڤانیچ؟ ئەمڕۆ پزیشکەکە هاوسەرگیری لەگەڵ خێزانی گالیسکەوانەکە کرد، کە ماوەیەکی کەم بەر لە ئێستا کۆچی دوایی کرد..."

تەنها تەماشایەکی ئیمیلیانم کرد، بەڵام بە شێوەیەکی ئاسایی نا، بەڵکوو بە شێوەیەک، پڕ لە ڕق و تووڕەیی، بە شێوەیەک، یەکسەر تێگەشت: چاوم لێی بوو لە شوێنی خۆی هەستا و ڕۆشتە لای تەختەخەوەکەی و وەک ئەوەی لە شتێکی ونبوو بگەڕێت، دەستی کرد بە گەڕان. منیش

سەرنجم ئەدا. بەم شێوەیە ماوەیەکی درێژ دەستی بە پشکنین کرد، لەو کاتەشدا کە خەریکی ئەم پشکنینە بوو، لەژێر لێوەوە هەر خەریکی منجەمنج بوو. بە بەردەوامی ئەم قسانەی دووبارە دەکردەوە: باشە ئەبێت چییان لێ هاتبێت؟ بە شێوەیەک دیار نەماون، وەک ئەوەی شەیتان دزیبنی!

چاوەڕێ بووم بزانم بەکوێ دەگات؛ چاوم لێ بوو ئیمیلیان کەوتبووە سەر چۆک و ژێر تەختەخەوەکەی دەپشکنی. نەمەتوانی چیتر لەمە زیاتر خۆم ڕابگرم.

پێم وت:

"سەیری ئێرە بکە ئیمیلیان، کێشەت چییە؟ بۆ کەوتوویتەتە سەر چۆک و ژێر تەختەخەوەکە ئەگەڕێیت؟"

"بۆ پانتۆڵەکان ئەگەڕێم لەژێر تەختەخەوەکە، ئاستافی ئیڤانیچ. ڕەنگە لەوێدا بێت، یاخود لە جێگەیەکی تر."

ئەزانی گەورەم، بەوپەڕی پەستییەوە پێم وت:

"بەڵام چ شتێک وات لێ دەکات بەم شێوەیە خۆتان بخەنە ناڕەحەتییەوە و گرنگی بە پیاوێکی بەدبەختی وەک من بدەن و ئەژنۆکانی خۆتان لە پای هیچ پیس بکەن؟"

"بەڵام ئاستافی ئیڤانۆڤیچ... من... مەبەستم هیچ نەبوو... تەنها پێم وا بوو ئەگەر بەباشی بۆی بگەڕێین، ڕەنگە لە

شوێنێکی ئەم ژوورەدا بیدۆزینەوە."

"ئمم! تەنها یەک خولەک گوێم بۆ ڕادێرە، ئیمیلیان!"

"چی، ئاستافی ئیڤانیچ؟"

"ئایا هەر بەڕاست، تۆ زۆر بەسادەیی ئەو پانتۆڵانەت وەک دزێکی چەپەڵ نەدزیوە و ئێستاش ئا بەم شێوەیە خزمەتم دەکەیت، لەبەر ئەوەی نان و نمەکت کردووم."

"تا ئەو ڕادەیە لێی تووڕە بووم، گەورەم" کاتێک ئەمبینی لەسەر چۆکەکانی کەوتووە و ژێر تەختەخەوەکە ئەگەڕێت بۆ شتێک، کە خۆشی لێی یەقینە لەو شوێنەدا نییە.

"نەخێر ئاستاڤی ئیڤانۆڤیچ."

بۆ ماوەیەکی زۆر بە ڕاکشاوی لەژێر تەختەخەوەکەدا ڕاکشابوو. لەپڕ لەسەر ئەژنۆکانی لەژێر تەختەخەوەکە هاتە دەرێ و لە بەردەممدا ڕاوەستا... تەنانەت ئێستاش ئەو ساتەم هەر لە بەرچاودایە، ئەڵێی ئێستا ڕووی داوە... ڕووخساری بە شێوەیەکی ترسناک زەرد هەڵگەڕابوو، بە شێوەیەک، کاتێک مرۆڤێک هەست بە تاوان بکات لە ناخی خۆیدا.

بە دەنگێکی تاساو و لەرزۆکەوە پێی وتم:

"نا، ئاساتافی ئیڤانیچ، من پانتۆڵەکانی تۆم نەبردووە."
هەموو جەستەی وەک شەقشەقە دەلەرزی، دەستی لەسەر سنگی دانابوو، ئەم بەڕاستی دیمەنە منی ترساند تەنانەت نەمتوانی لە شوێنی خۆمدا، کە لە نزیک پەنجەرەکەوە دانیشتبووم، جووڵە بکەم.

بەڵێ، وەڵامم دایەوە:

"زۆر باشە ئیمیلیان، با واز لەو باسە بهێنین، من داوای لێبووردنت لێ دەکەم، تکایە بمبوورە ئەگەر بە شێوەیەکی گەوجانە پەنجەی تۆمەتم ئاڕاستەی تۆ کرد.
"نەفرەت لە پانتۆڵ. ئێمە بە ونبوونی ئەو پانتۆڵانە نامرین. سوپاس بۆ خودا، هێشتا دەستەکانمان لەکار نەکەوتووە، پێویستیشمان بەوە نییە دەست لە کەس پان بکەینەوە، ئەتوانین بەردەوام بین لە ژیانکردن و بە ئارەقەی ناوچەوانمان ڕۆزیی خۆمان پەیدا بکەین...

ئیمیلیان لە بەردەممدا بەپێوە ڕاوەستابوو، بۆ ماوەیەک گوێی بۆ شل کردبووم، پاشان دانیشت، تەواوی ئەو ئێوارەیە لە شوێنی خۆی جووڵەی نەکرد، ڕێک

لە پەیکەرێکی بێگیانی دەکرد، لەناو خۆیدا ڕۆچووبوو.
کاتێک چوومە سەر جێگەکە، ڕاکشام بۆ ئەوەی بخەوم،
ئەو هێشتاش هەر لە هەمان شوێنی خۆی دانیشتبوو.
سەرلەبەیانی کە بەئاگا هاتم، تەماشام کرد ئیمیلیان
لەسەر زەوییەکە بە ڕووتی خەوی لێ کەوتبوو، تەنها
پاڵتۆکەی لە خۆی ئاڵاندبوو، لە سەرمادا خۆی لە
ناویدا گرمۆڵە کردبوو. هەستم کرد ئەو بەدبەختە هێندە
بەقووڵی هەستی بە ئازاری ویژدان کردبوو، کە زاتی
ئەوەی نەکردبوو بچێتە سەر تەختەخەوەکەی بنوێت.

بەڵێ، گەورەم، لەدوای ئەو ڕۆژەوە، بە شێوەیەکی زۆر
ترسناک خۆشەویستیم بۆ ئەو پیاوە نەما، تەنانەت من
ڕۆژانی سەرەتاش هەر خۆشم نەدەویست. زۆر ڕقم لێی
دەبووەوە. وا هەستم ئەکرد بۆ نموونە، کە کوڕی خۆم
دزی لێ کردووم. بەڕاستی وا هەستم ئەکرد کوڕی خۆم
ئازاری ڕۆحی داوم و هەستێکی کوشندەی پێ بەخشیوم.
بە خۆمم ئەوت: ئاخخ، ئیمیلیان، ئیمیلیان!
بەڵام گەورەی بەڕێز، ئەزانی ئیمیلیان چیی کرد؟
بۆ ماوەی دوو حەوتووی تەواو سەری لە
مەیخواردنەوە هەڵنەگرت، بەیانی ئەچووە دەرەوە،
هەتا شەو دەگەڕایەوە وەک ئالوودەبوویەک خەریکی
مەیخواردنەوە بوو. لە ماوەی ئەو دوو حەوتووەدا،

وشەیەکیش چییە لە زاری دەر نەهات. هەستم ئەکرد ئازاریک روحی ویران دەکات. ئەیخواردەوە، بۆ ئەوەی بیر و هوشی خوی بیناگا بکات و لە ئازارەکانی خۆیدا نقوم ببیت. لە کوتاییدا ئیمیلیان دەستی لە خواردنەوە هەلگرت. هەستم کرد هەرچی پی بوو، لە مەیخواردنەوەدا بەفیڕۆی داوە و هیچی بە دەستەوە نەماوە تا ڤۆدکای تری پی بکریت... ئا بەم شیوەیە بوو. بیرمە لە نزیک پەنجەرەکە دانیشتبوو. لەبیرمە بەو شیوەیە بە بیدەنگی نزیکی سی دانە رۆژی تەواو لەو شوینەدا دانیشتبوو بی ئەوەی قسەیەکی لە زار بیتە دەری؛ بەلام لەناکاو بینیم دەگریا؛ لەوێدا دانیشتبوو دەگریا، بەلام چ گریانێک! چاوەکانی ئەتوت کانییە، گەورەم، تەنانەت هەستم کرد کە خۆشی هەست بەوە ناکات، کە فرمێسک لە چاوەکانییەوە وەک لێزمەباران تنۆکتنۆک دەکەونە خوارەوە. بە شێوەیەکی زۆر کەساس دەگریا.

ئای چەند دڵهەژێنە و ئازاربەخشە گەورەم، بینینی گریانی پیاوێکی بەتەمەن، بیهێننە بەرچاوی خۆتان، پیاوێکی بەتەمەنی وەک ئیمیلیان، لەناو خەم و ئازاردا بەو شێوەیە بەکوڵ بگری و فرمێسک لە چاوە کزەکانی بێتە خوارەوە.

پێم وت:

"کێشەت چییە ئیمیلیان؟"

لە نووکی پێیەوە هەتا توقەسەری تەواوی جەستەی وەک شەقشەقە دەلەرزی. لەدوای ئەو رۆژەوە کە پانتولەکان دیار نەمابوون، یەک وشەش چییە لە زارم دەر نەهاتبوو بەرامبەری.

وتی:

"هیچ نییە... ئاستافی ئیڤانیچ."

"بێقەزا بێت، ئیمیلیان! نایەوێت ئاوا لە خۆت بکەیت، ئەوەی ڕۆشت، ڕوشت. پیاوی باش، هێندە لە دڵی مەگرە!"

زۆر هەستم بە پەژارە دەکرد بەرامبەری.

"تەنیا ئەوەیە... حەز دەکەم شتێک بکەم... ئاستافی ئیڤانیچ... پێم خۆشە کارێک بکەم"

"بەڵام چ جۆرە کارێک، ئیمیلیان؟"

"هیچ جیاوازییەکی بۆ من نییە... گرنگ نییە چ جۆرە کارێک بێت، تەنها ئەمەوێت کارێکم هەبێت، هەر وەک چۆن پێشتر هەمبوو چووم بۆ لای خاوەن کارەکەی پێشووم، داوام لێ کرد. جوان نییە بۆ من بەم شێوەیە ببم بە بارگرانی بەسەرتەوە، ئاستاڤی ئیڤانۆڤیچ، ئەگەر کارێکم دەست بکەوێت... ئەوە هەموو شتێکت بۆ دەگێڕمەوە... تەنانەت نرخی ئەو خواردنەشی کە پێت بەخشیوم..."

"بەسیکە ئیمیلیان، بەس! ئەم قسە هەڵیتوپەڵیتانە چییە

دەیانڵێیت؟ گریمان با وای دابنێین تۆ گوناهێکیشت ئەنجام داوە؛ زۆر باشە، چیتر هەموو شت کۆتاییی پێ هاتووە! ئەوەی ڕابرد، ڕابرد، هاوڕێ گیان! تکایە با چیتر باسی ئەو بابەتە نەکەین. هەر وەک پێشوو، چۆن بەیەکەوە ئەژیاین، با بژین. هەر وابزانە هیچ ڕووی نەداوە!"

"نەخێر ئاستافی ئیڤانیچ... ڕەنگە تۆ تا ئێستاش ئەو بابەتەت هەر لە مێشکدا بێت... بەرامبەر بە من، لێم یەقینە هەر پێت وایە من پانتۆڵەکانی تۆم دزیوە... بەڵام من پانتۆڵەکانی تۆم نەدزیوە."

"زۆر باشە، ئیمیلیان تۆ ڕاست دەکەیت. ڕێک کەوتین تکایە ئەم بابەتە لەبیر خۆت بەرەوە، چونکە من لەبیر خۆمم بردەوە!"

"نەخێر، ئاستافی ئیڤانیچ... تازە من ناتوانم لەلای تۆ بژیم... ئەبێت بمبووریت، ئاستافی ئیڤانیچ."

پێم وت:

"بێ بەلا بێت، ئیمیلیان، چ کەسێک لێرە بێزاری کردوویت، یان هەوڵی داوە لەم ماڵە دەرت بکات؟ ئایا من کاری لەم شێوەیەم کردووە بەرامبەرت؟"

"نا... بۆ من جوان نییە چیتر لەمە زیاتر میوانداریيەکەت خراپ بەکار بهێنم، ئاستافی ئیڤانیچ؛ باشترە بڕۆم.

بینیم هەر بەڕاستی لە شوێنی خۆی هەستایەوە و پاڵتۆکەی یا بە شانیا... هەستی بە گوناح دەکرد، یابووی

لە کەللەی بڕوات، هەروەها شتەکانی کۆ کردەوە.

بەڵام بۆ کوێ دەڕۆیت، ئیمیلیان؟ بۆ تۆزێک بیر ناکەیتەوە، ئاخر چ شوێنێک هەیە تۆ بۆی بچیت؟"

نا... ئاستافی ئیڤانیچ، باشترە بۆ من بڕۆم، هەوڵ مەدە بەرم پێ بگریت، بە خوداتان ئەسپێرم، ئاساتافی ئیڤانیچ... لەپڕ لە پڕمەی گریانی دا و هۆنهۆن فرمێسک بە چاوەکانیدا جۆگەلەی بەست... "وا باشترە ئاستافی ئیڤانیچ، چونکە من ئەزانم تۆ زۆر هەڵسوکەوتت لەگەڵ من گۆڕاوە، ئەو ئاستافییەی جاران نیت، کە پێشتر بوویت."

وتم:

"بۆ وا گومان دەبەیت، کە من گۆڕاوم و وەک پێشتر نیم؟ بڕوات بێت، من نەگۆڕاوم، هەر وەک پێشترم. ئەوە تۆیت گۆڕاویت، وەک منداڵێکی گەمژە هەڵسوکەوت دەکەیت. دڵنیا بە ئەگەر بڕۆیت بەتەنها بژیت، لەناو دەچیت، ئیمیلیان."

"نا، ئاستافی ئیڤانیچ... تۆ بەم دواییانە، پێش، ئەوەی لە ماڵ دەر بچیت، دەرگای سندوقەکەت کڵۆم دەکەیت. کاتێکیش ئەمە ئەبینم، ئاستافی ئیڤانیچ، هەردوو چاوم پڕ دەبێت لە فرمێسک... چونکە ئەزانم چیتر تۆ هیچ متمانەیەکت بە من نەماوە لەم ماڵەدا... بۆیە تکات لێ

ئەکەم، ڕێ لە ڕۆشتنم مەگرە، چونکە ئەمە باشترە بۆ هەردووکمان، ئاستافی ئیڤانیچ، داوای بەخشینت لی دەکەم، ئەگەر لەم ماوەیەی بەیەکەوە ژیاوین، ئازارم دابێت یان بووبێتم بە ئەرک بەسەرتەوە."

بەڵێ، ئا بەم شێوەیە ئیمیلیان ماڵەکەی بەجێ هێشت، گەورەم. ڕۆژێک چاوەڕوانم کرد، ڕوژێکی تریش... بە خۆمم وت: ڕەنگە ئەم ئێوارەیە بگەڕێتەوە... بەڵام نەگەڕایەوە. ڕۆژی سێیەمیش تێپەڕی و ئەو هەر نەگەڕایەوە. ترسام، نیگەرانی سەرتاپای بیر و هۆشمی گرتەوە. تەنانەت وام لێ هاتبوو نە نانم بۆ ئەخورا، نە ئاوم بۆ ئەخورایەوە،تەواوی شەوەکانیش لەسەر جێگەکەم ڕادەکشام، بەڵام خەویش لە چاوەکانم توورابوون. ئەو پیاوە بەتەواوی لە پەلوپۆی خستبووم! ڕۆژی چوارەم دەستم کرد بە گەڕان بەشوێنیدا. مەیخانە نەما سەری پیا نەکەم، بەو هیوایەی لە یەکێک لەو مەیخانانەدا بیدۆزمەوە. هەرکەسێکم بەرچاو بکەوتبا، سۆراغی ئیمیلیانم لێ دەکرد. کەس نەما پرسیاری لێ نەکەم! بەڵام ئیمیلیان لە هیچ شوێنێک نە دەنگی هەبوو نە ڕەنگ، وەک ئەوەی زەوی قوتی دابێت.

بە خۆمم وت:

ڕەنگە لە شوێنێک بەسەرخۆشی کەوتبێت و گیانی

سپاردبێت هەر وەک سەگێک چۆن لەژێر پەرژینێکدا لێرەولەوێ لە تینوێتی و برسێتیدا گیان دەسپێرێت...

بە جەستەیەکی تێکشکاو و نیوەمردوو، بێ هیوا دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە. بڕیارم دەدا سەرلەبەیانی ڕۆژی دواتریش خۆم ئامادە بکەم و جارێکی تریش بەشوێنیدا بگەڕێم، بەو هیوایەی بیدۆزمەوە... نەفرەتم لە خۆم ئەکرد کە هێشتم ئەم گەمژەیە بەپێی ویستی خۆی لەم ماڵە دەر بچێت. بەڵام نزیکی چێشتەنگاوی ڕۆژی پێنجەم "کە ئەو ڕۆژە ڕۆژی جەژن" بوو. گوێم لە جیرە جیرِی دەرگاکە بوو...بەڵام کێ ببینم لە ئیمیلیان زیاتر! بەڵام لەژێر چ بارودۆخێکدا! ڕووخساری بە شێوەیەکی ترسناک شین هەڵگەڕابوو، قژی ئاڵۆزکاو و خۆڵاوی بوو. وەک ئەوەی لەسەر شەقامەکان نوستبێت؛ هێندە لاواز بوو، شێوەی دارحەیزەرانی گرتبوو.

"پاڵتاوە شڕ و هەژارانەکەی لەبەری خۆی داکەند، چوو لەسەر سندوقەکەم دانیشت و بە شێوەیەک، کە هەستم بە زەلیلی دەکرد لە ڕووخساریدا، کەوتە ڕوانین لێم. بەڵێ گەورەم، زۆر دڵم خۆش بوو بە گەڕانەوەی، بەڵام لێشتان ناشارمەوە، کە لە ناخیشەوە هەستم بە ئازارێکی زۆر دەکرد، ئەتوت دڵم لە سینەم دەر دەهێنن. ئەزانی گەورەم، ئەگەر من وەک ئەو بەدبەختەم لێ بەسەر بهاتایە، ئەوە وەک سەگێک لە سووچێکدا بۆخۆم

کزۆڵەم دەکرد تا بۆخۆم ئەتۆپیم و هەرگیزیش ئامادە نەدەبووم بگەڕێمەوە بۆ شوێنێک، کە پێشتر بەجێم هێشتبێت... بەڵام ئیمیلیان چوونکە هێندە مرۆڤێکی سادە بوو، گەڕایەوە...

بە شێوەیەکی سروشتی زۆر سەختە بۆ مرۆڤ، کە پیرەپیاوێک ببینێت لە وەها بارودۆخێکدا. دەستم کرد بە لاواندنەوەی و هەوڵم دا بە هەر ڕێگەیەک بێت، ئاسوودەی بکەم.

بەڵێ، پێم وت:

"ئیمیلیان، کارێکی باشت کرد گەڕایتەوە، زۆر خۆشحاڵت کردم. ئەگەر تۆزێکی تر درەنگ بکەوتیتایە، ئەوە منت لێرە نەدەبینی، چونکە خۆم ئامادە کردبوو سەرلەنوێ لەشوێنت بگەڕێم. ئەی بەڕاست، برسیت نییە؟ هیچت خواردووە؟"

"نانم خواردووە، ئاستافی ئیڤانیچ."

گومانم کرد لەوەی نانی خواردبێت. بۆیە پێم وت:

"بەڕاست، نانت خواردووە؟ گوێ بگرە هاوڕێ گیان... هەندێک شۆربای کەلەرمی دوێنێ ماوە، خواردنێکی خراپ نییە، هەندێک گۆشتیشی تێدایە... بگرە هاوڕێ گیان،

ئەمەش هەندێک نان و تۆزێک پیاز... فەرموو دەست بکە بە خواردنی، با تۆزێک هێز بێنێتەوە بەبەرتدا."

ئەزانی گەورەم، کاتێک خواردنەکەم خستە بەردەستی، هێندە بە تامەزرۆییەوە ئەو خواردنەی ئەخوارد... یەکسەر پەیم بەوە برد، کە پێدەچوو ماوەی ئەو سێ ڕۆژەی پێشوو، دەمی لە خواردنەوە نەدابێت و لە برسا خەریک بووە بمرێت... ئەم بێزووکردنەم لێم بینی، بۆم دەر کەوت برسێتی پاڵی بەم کلۆڵەوە ناوە بگەڕێتەوە بۆ لام. کە دەمبینی، زۆر زگم بە حاڵی دەسووتا. بڕیارم دا دەستبەجێ بچم بۆ دوکانی مەیفرۆشییەکەی نزیکمان و هەندێک ڤۆدگای بۆ بهێنم و هەرچۆنێک بێت، تۆزێک ژیانی تێ بەگەڕێنمەوە و دوای ئەوەش، ئاشتی دەکەمەوە... پێشی ئەڵێم هیچ شتێکم لە دڵدا نەماوە بەرامبەری. بەم شێوەیە چووم ڤۆدکام هێنا.

وتم:

"بگرە ئیمیلیان، وەرە با بەخۆشی یەکەوە پێکەکانمان هەڵدەین، بەخۆشی جەژنەوە... وەرە با بخۆینەوە... ئەمە سەرلەنوێ شادیت بۆ ئەهێنێت، هاوڕێ گیان!"

ئاگام لێ بوو چلێسانە دەستی برد بۆ پەرداخەکە و ویستی پەرداخەکەم لێ نزیک بکاتەوە، بۆ ئەوەی پێکێکی بۆ تێبکەم... پێکێکم بۆ تێکرد، وام گومان برد،

هەر پیکە ڤۆدکاکەم بۆ تێکرد، یەکسەر ئەینێت بە سەریەوە و قەترەی لێ ئەبڕێت. بەلام زۆر سەیر بوو، پەرداخەکەی بەرز کردەوە و نزیکی لێوەکانی کردەوە و دوودڵ دیار بوو لەوەی بیخواتەوە یان نەیخواتەوە! دەستبەجێ پەرداخەکەی لەسەر مێزەکە دانایەوە، بێ ئەوەی بیخواتەوە و بەپەلە دەستیشی کێشایەوە دواوە

"چی بوو ئیمیلیان، بۆ ناخۆیتەوە؟"

"نا، ئاستافی ئیڤانیچ... شتی وا ناکەم."

"نایخۆیتەوە"

"ئاخر... من، ئاستافی ئیڤانیچ، پێم وا بێت... چیتر ناخۆمەوە... ئاستافی ئیڤانیچ."

"ئەمە شتێکی زۆر باشە کە بڕیارت داوە نەخۆیتەوە، ئیمیلیان... بەلام لەوە تێنەگەیشتم، کە ئایا ئەتەوێت بۆ هەمیشە نەخۆیتەوە یان هەر ئەمڕۆ؟"

ئیمیلیان بێدەنگ بوو و وەلامی نەدامەوە. هەر دوای تۆزێک، بەوردی تەماشام کرد، بینیم سەری خستە ناو هەردوو دەستیەوە، منیش لێم پرسی:

"هەست ئەکەم دۆخت زۆر باش نەبێت ئیمیلیان؟ ئایا نەخۆشیت؟"

"بەڵێ... ئاستافی ئیڤانوڤیچ، هەست ناکەم باش بم، من

نەخۆشم."

هاوکاریم کرد بۆ ئەوەی بیخەمە سەر تەختەخەوەکەی و کەمێک پشوو بدات. بینیم، ئەو داماوە بە ڕاستی بوو، دۆخی تەندروستی بێئەندازە خراپ بوو، سەری ئەتوت تەنوورە ئەسووتێت، تەواوی جەستەشی ئەلەرزی، تایەکی زۆر ترسناکی هەبوو. تەواوی ئەو ڕۆژە لەپاڵیەوە دانیشتم. سەرلەئێوارە تەماشایم کرد، تەندروستیی لە پێشتر زۆر خراپتر بووە. هەندێک شەرابی کەڤاس و تۆزێک کەرە و هەندێک پیاز لەگەڵ هەندێک وردەناندا تێکەڵم کرد و ژەمەخۆراکێکم لێ دروست کرد.

پێم وت:

"فەرموو ئیمیلیان، هەندێک خۆراک بخۆ؛ بەڵکوو تەندروستیت باشتر بێت!"

بەڵام ئەو تەنها سەری ناڕازیبوونی بۆ جووڵاندم و وتی:

"نا، ئاستافی ئیڤانیچ، ئەمڕۆ دڵم هیچ نابات، نانم بۆ ناخورێت."

هەستام چام بۆ ئامادە کرد. ئەو پیرێژنە داماوەشم خستبووە نارەحەتییەکی زۆرەوە، ئاخر ئەو بەدبەختە

خۆشی تەندروستی باش نەبوو، مەبەستم خاوەنماڵەکەم بوو، ئەوەی بەشێک لە ژوورەکەی بەکرێ پێ دابووم. بەڵام ئیمیلیان، تەنانەت چایەکشی قبوڵ نەکرد.

دۆخی باش نەبوو، لەوە دەترسام زۆر لەمە خراپتریشی لێ بێت.

ڕۆژی سێیەم تێپەڕی، ئیمیلیان بارودۆخی هەر بەرەو خراپی دەڕۆشت. بڕیارم دا بچم پزیشکێکی بۆ بهێنم، تا تەماشایەکی بارودۆخە نالەبارەکەی ئیمیلیان بکات. پزیشکێکی ناسیاوم هەبوو بە ناوی (کۆستۆپراڤۆڤ)، ئەو کاتانەی کە هێشتا لە دوایین شوێنی کارکردنم دەژیام چارەسەری دەکردم. پزیشکەکە هات، پشکنینی بۆ هاوڕێ هەژارەکەم کرد و تەنیا وتی:

"ئەم نەخۆشە تەندروستیی زۆر خراپە... من ناتوانم هیچی بۆ بکەم، پێویستیش ناکات دووبارە بنێریتەوە بەشوێنمدا، چونکە ئەم نەخۆشە لێبۆتەوە، هیچ ئومێدێکی دڵخۆشکەر نییە بۆ ئەوەی بەزیندوویی بمێنێتەوە... بەڵام بە هەرحاڵ، ئەتوانیت هەندێک دەرمانی پێ بدەین، ئەویش بەپێی ئەوەی خۆم بۆی دەنووسم."

بەڵێ، لە ڕاستیدا من ئەو دەرمانەی پزیشکەکەی ناسیاوم بۆ ئیمیلیانی نووسی، هەر پێم نەدا. چونکە زانیم

پزیشکەکە تەنها لەبەر دڵی من ئەو دەرمانانەی نووسی، چونکە خۆشی ئەیزانی هیچ سوودێکی نییە.

لە کاتێکدا ڕۆژی پێنجەم هات. ئیمیلیان لە بەردەمما ڕاکشابوو، دواهەناسەکانی خۆی لەم ژیانەدا ئەدا، گەورەم. من لە نزیک پەنجەرەکەوە دانیشتبووم، هەندێک کاری درووومانیم هەبوو، خۆم بەوەوە خەریک کردبوو. پیرەژنەکەی خاوەنماڵیشم ئاگردانەکەی گڕ دەدا. هەرسێکمان بێدەنگ بووین.

دڵم لە ئازاری بینینی ئیمیلیان لەو بارودۆخە بێهیوایەدا ئەکوڵا. هەرچەند ئەو جەستە وشکەڵەیم ئەبینی، وام وێنا دەکرد کوڕی خۆمە و خەریکە لەدەستی ئەدەم. ئەمزانی تەواوی ئەو کاتە ئیمیلیان چاوی لە چاوەکانم بڕیبوو: تێبینی ئەوەم کرد، ئەیەوێت شتێکم لا بدرکێنێت، بەڵام بە ڕووی خۆیدا ناهێنێت، من هەر لەسەرەتای ئەو ڕۆژەوە کە گەڕایەوە، هەستم بە چاوەکانی کردبوو، کە ئەیەوێت شتێکم لا بدرکێنێت. بەڵام هەستم ئەکرد ناوێرێت ئەو شتەم پێ بڵێت. لە کۆتاییدا تەماشام کرد، بینیم چاوەکانی لەسەر من ناترووکێنێت. بەڵام کاتێک چاوەکانی هاتە ئاستی چاوەکانی من، ڕاستەوخۆ چاوەکانی خۆی لە خوارەوە بڕی.

"ئاستافی ئیڤانیچ!"
"بەڵی، ئیمیلیان؟"
"ئایا ئەگەر ئەم پاڵتۆیەی من ببرێت بۆ بازاری کۆنەکە، بە بڕوای تۆ چەندێک دەکات، ئاستافی ئیڤانیچ؟"
بەڵی، پێم وت:
"لە ڕاستیدا زۆر دڵنیا نیم، ئیمیلیان، بەڵام ڕێی تێدەچێت نزیکەی سێ ڕۆبڵێک بکات."
ئەمەم تەنها لەبەر دڵی ئیمیلیان وت، بۆ ئەوەی ئەم بوونەوەرە دڵسافە بەو قسەیە ئاسوودە بکەم؛ لە ڕاستیدا ئەگەر ئەم پاڵتۆ شڕەم ببردایەتە بازاڕ، هەر باسی فرۆشتنیشیم نەکردایە و خەڵکی بە دەستمەوە بیانبینیایە، تێر پێم پێدەکەنین، جا وەرە ئەگەر بهاتایە بمویستایە شتێکی ئاوا بێکەڵک و شڕەیەکی دڕاوی ئاوام بفرۆشتایە.
ئیمیلیان کەوتەوە قسەکردن وتی:
"بەڵام من پێم وایە تۆزێک زیاتریشی پێ بدەن، ئاستافی ئیڤانیچ، چونکە ئەو قوماشەی ئەم پاڵتۆیەی لێ دروست کراوە، قوماشی کەتانە، ئیتر چۆن خەڵک حەز ناکات زیاتر لە سێ ڕۆبڵیشی پێ بدات؟"

وتم:
"نازانم ئیمیلیان. بەڵام ئەگەر بەڕاستی بتەوێت بیفرۆشیت، ئەو کاتە بەدڵنیاییەوە ئەبێت لە سەرەتادا

داوای نرخێکی زیاتر بکەیت."

ئیمیلیان بۆ ساتێک بێدەنگ بوو. پاشان جارێکی تر بانگی کردمەوە:

"ئاستافی ئیڤانۆڤیچ!"

"بەڵێ، ئیمیلیان؟"

"کاتێک مردم، پێویستە لەسەرت ئەم پاڵتۆیە بفرۆشیت؛ پێویست ناکات بەم پاڵتۆیەوە دفن بکرێم. من ئەتوانم بێ ئەم پاڵتۆیەش درێژە بە ژیانی ئەولام بدەم... ئەم پاڵتۆیە نرخێکی هەر هەیە بۆ خۆی... ڕەنگە سوودێکی بۆ تۆ هەبێت و شتێکت لێ دەست بکەوێت.

ئەزانی گەورەم، کاتێک گوێبیستی قسەکانی ئەو ئیمیلیانە بەدبەختە بووم، دڵم لە خەفەتا خەریک بوو لە سینەم ئەهاتە دەرەوە، بڕواتان بێت، نازانم چۆن ئەو هەستە ئازاراوییەتان وەک خۆی بۆ ڕوون بکەمەوە. کاتێک ترسی مردنم لە چاوەکانیدا ئەبینی، وەخت بوو ئاگرم تێ بەر دەبوو. دووبارە هەموومان بۆ چەند ساتێک بێدەنگ بووینەوە. بێدەنگییەکی سامناک بوو، نزیکەی کاتژمێرێک بەم شێوەیە تێپەڕی. دووبارە تەماشای ئیمیلیانم کردەوە، بینیم ئەویش چاوی تێ بڕیوم، دووبارە کاتێک چاوەکانی کەوتەوە سەر چاوەکانم، یەکسەر چاوەکانی خۆی لابرد.

پێم وت:

"حەزت لە ئاوی سارد نییە، بۆت بهێنم؟"

"بەڵێ، ئاستافی ئیڤانیچ، کەمێک ئاوم بدەرێ، با بیخۆمەوە... خودا پاداشتت بداتەوە..."

"ئیمیلیان، مەیلت لە هیچ شتێکی دی نییە بۆت بهێنم؟"

"نا، ئاستافی ئیڤانیچ، هیچ شتێکی ترم ناوێت... بەڵام... من..."

"بەڵام تۆ چی، ئیمیلیان؟"

"تۆ ئەوە دەزانیت..."

"ئەتەوێت بڵێی چی، ئیمیلیان؟"

"پانتۆڵەکان... ئەزانیت... ئەوە من بووم کە بردمن، ئاستافی ئیڤانیچ..."

"زۆر باشە ئیمیلیان... خودا بتبەخشێت، ئەی پیاوی هەژار. چ پیاوێکی هەژاریت تۆ، ئیمیلیان! بۆخۆت بە ئاسوودەیی و دەروونێکی ئارامەوە بخەوە..."

ئەزانی، گەورەم من لەو کاتەدا ڕووی خۆم وەرگێڕا بەودیودا، لەبەر ئەوەی گەرووم پڕ بوو لە گریان و چاوەکانیشم پڕ ببوون لە فرمێسک، هەر ڕووم کرد بەودیودا، لە پرمەی گریانم دا و فرمێسک لە چاوەکانمدا جۆگەلەیان بەست. ئاخر نەمدەویست ئیمیلیان لە دواساتەکانی ژیانیدا من بەو شێوەیە ببینێت."

"ئاستافی ئیڤانیچ...!"

بەم شێوەیە بانگی کردم. تەماشام کرد، لە چاوەکانیدا ئەوەم ئەبینی، کە ئارەزووی دەکرد هەندێ شتی زیاترم پێ بڵێت، هەوڵی دا تا لە شوێنی خۆی ڕاست بێتەوە، بەئاستەم لێوەکانی دەجووڵاند... ڕەنگی سوور هەڵگەڕا و تەماشای کردم... لەناکاو بینیم وردەوردە ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕا؛ لەو ساتەدا یەک هەناسەی قووڵی هەڵمژی بەڵام نەیتوانی بیداتەوە و سەری بە لادا هات و گیانی سپارد و بۆ ئاستانەی خودا گەڕایەوە...